گوڵبژێرێك له

# زیكرەكانی ڕۆژانەو شەوانە

له قورئان و فەرموودە(صەحیح)ەكانی

پێغەمبەری خوادا (ﷺ)

ئامادەكردنی/ حەمزە بەرزنجی

**له ڕێگای خوای گەورەدا دەبەخشرێت، نافرۆشرێت**

**خـوای گـەورە دەفـەرموێت:** ﴿ فــاذكُروني أذكُـــركُم وَاشكُروا لي وَلا تَكفُرونِ ﴾ (**البقرة: ١٥٢**).

**واتە: ذیکر و یـادم بکـەن، بـاس و یادتـان دەکـەم و بێ باوەڕی مەکەن بەرامبەرم.**

**وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:** (( مَثَلُ الّذي يَذكُرُ ربَّهُ وَالّذي لا يَذكُرُ ربَّهُ مَثَلُ الحَيِّ والمَيّت)).**البخاري مع الفتح ٢٠٨/١١**

**واتە: نمونـەی ئـەو کەسـەی یـادی خـوای دەکـات و ئەو کەسەی کـە یـادی خـوا ناکـات وەکـوو نمونـەی زیندوومردوو وایە.**

## هەستان لە خەو

١- (( ألحَمـدُ للهِ الّـذي أحْيانـا بَعْـدَ مـا أماتَنـا وَإليـهِ النُّشوُر)). البخاري مع الفتح ١١٣/١١ ومسلم ٢٠٨٣/٤.

واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ژیاندیذیی‌یەوە دوای ئەوەی کە مراندینی(مەبەست بە مراندنێکی مەجازی‌یە کە خەوتنە)وە زیندوبونەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

## پێش نوستن

١- (( ئەگەر چویتە سەر جێگاکەت (آيـةَ الكُرسي) بخوێنەو تەواوی بکە. چونکە پارێزەرێکت لەلایەن خواوە لەگەڵدا دەبێت وشەیطان نزیکت ناکەوێتەوە تا بەیانی )).البخاري مع الفتح ٤٨٧/٤.

٢–(( بِاسمِكَ اللهُمَّ أمُوتُ وَأحيا)). البخاري مع الفتح ١١٣/١١ ومسلم ٢٠٨٣/٤ .

**واته: به ناوی تۆوه خوایه دهمرم و دهژیم.**

## داچڵهكین له خهودا و خهو لێنهكهوتن

(( أعوذُ بِكَلماتِ اللهِ التّامّات مِنْ غَضَبِهِ وَعِقابِهِ. وشَرِّ عِبادِهِ وَمِن هَمَزاتِ الشّياطينِ وأن يَحضُرونِ )). أبو داود ١٢/٤ وأنظر صحيح الترمذي ١٧١/٣. وهو حديث حسن، حسّنَهُ الألباني في صحيح أبي داود برقم(٣٢٩٤) بلفظ متقارب.

**واته: پهنا ئهگرم به ووشه تهواوهكانی خوای گهوره لهخهشم و سزایو له خراپهی بهندهكانیو له شێتی شهیطانهكان و لهو كاتانهی كه له ژیاندا دێنه لام بۆ گومڕاكردنم یان كاتێ لهسهر مهرگ دام دێنه لام.**

## ئەگەر خەونی خۆش یان ناخۆشت بینی

خــەونی خــۆش و چــاك لــە لایــەن خواوەیــەو خەونی ناخۆش لە شەیطانەوەیە. ئەگەر یەكێك لـە ئێوە خەونی خۆشی بینی با لـە لای خۆشەویسـتی خـۆی نـەبێ باسـی نـەكات... فەرموودەكـە... وە كورتەی ئـەو شـتانەی كـە دەیكات لـەكاتی بینینـی خەونی ناخۆش دا ئەمانەن:

١- سێ جار تف دەكات بە لای چەپیدا.

٢- ســێ جــار پــەنا دەگــرێ بــەخوای گــەورە لــە شەیطان و لە خراپەی ئەوەی كە بینوویەتی.

٣- لە لای كەس باسی ناكات و نایگێڕێتەوە.

٤- لەسەرئەو لایە وەردەگەڕێ كە لەسەری بووە.

٥- هەڵدەستێو نوێژ دەكات ئەگەر ویستی.

## ذیكرەكانی بەیانیان و ئێواران

١- بــەیانیان بڵــێ:(( أللهــمَّ بِــكَ أصــبَحنا. وَبِــكَ أمسَینا. وَبِكَ نَحیا وَبِكَ نَموتُ وَإلَیكَ النُّشور )).صحیح الترمذي ١٤٢/٣.

واتە: خوایە بە ناوی تۆوە بەیانیمان بەسەردا هات و ئێوارەمان بەسەردا هاتوو بەناوی تـۆوە دەژیـم و دەمرم و زیندوو بوونەوە بۆ لای تۆیە.

وە ئێواران بڵێ: (( اللهُمَ بِكَ أمْسَینا وَ بِكَ أصْبَحْناوبِكَ نَحْیا وَ بِـكَ نَمـوتُ وَ إلیـك المــَصیر )) واتـە: خوایـە بەناوی تـۆوە ئێوارەمان بەسـەردا هـات و بـە نـاوی تـۆوە بـەیانیمان بەسـەردا هـات و بـە نـاوی تـۆوە دەژیم و دەمرم وە چارەنوس بۆلای تۆیە.

٢-یان بەیانیان و ئێواران بڵێ: (( اللهمَّ أنتَ رَبِّي لآ إلهَ إلاّ أنتَ خَلَقْتَني وَأنا عَبدُكَ، وَأنا على عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مـا اسـتَطَعْتُ. أعـوذُ بِـكَ مِـنْ شـرِّ ماصَـنَعْتُ. أبـوءُ لَـكَ

بِنِعمَتِكَ عَلَيَّ وَأبوءُ بَذنبي. فاغفِر لي فإنَّهُ لا يَغفِرُ الذُّنوبَ إلاّ أنتَ)).هەرکەسێ ئێوارە بەیەقینەوە پێی بیڵێ و شەو بمرێ دەچێتە بەهەشتەوە. وە هەرکەسێ بەیانی بە یەقینەوە بیڵێ و ئەو ڕۆژە بمرێ دەچێتە بەهەشتەوە/أخرجه البخاري ٧/١٥٠.

واتە: خوایە تۆ پەروەردگارمی هیچ پەرستراوێك نی‌یە بە هەق جگە لە تۆ. بەدیت هێناوم و من بەندەی تۆم و من لەسەر پەیمان و بەڵێنەکەمم کە بەتۆم داوە تا بتوانم. پەنات پێ دەگرم لەخراپەی ئەوەی ئەنجامم داوە لە گوناه. دان ئەنێم بە نیعمەتەکانتدا لەسەرم و دان ئەنێم بە گوناهەکانم دا. ساخوایە لێم خۆش بە ، بە ڕاستی کەس لە گوناه خۆش نابێ جگە لە تۆ.

٣- (( بِسمِ اللهِ الَّذي لا يَضُرُّ مَعَ اسمِهِ شَيءٌ في الأرضِ وَلا في السّمآءِ وَهَوَ السَّمِيعُ العَلِيم )) بەیانیان و ئێواران سێ جار. هەرکەسێ بەیانیان سێ جار و ئێواران

سێجار بیڵێ هیچ زیانی پێ ناگەیەنێ/صحّحَهُ الألباني في صحيح أبي داود برقم(٤٢٤٤). انظر صحيح ابن ماجه ٢/ ٣٣٢ وصحيح الترمذي ١٤١/٣. وحَسَّن إسناده العلامة ابن باز في تحفة الاخيار (ص٣٩).

واتە: بە ناوی ئەو خوایەی لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێك زیان ناگەیەنێ نە لە زەویو نە لە ئاسماندا ئەو خوایە بیسەرو زانایە.

## خواردن و خواردنەوە

پێش خواردن بڵێ (بِسم الله). واتە: بە ناوی خوا. بەڵام ئەگەر بیرت چوو ئەوا هەرکاتێ بیرت کەوتەوە بڵێ: (( بِسْمِ الله في أوَّلِهِ وَآخِرِهِ )). صحيح الترمذي ١٦٧/٢.

وە کە تەواو بوویت و لێ بوویتەوە بڵێ: (( ألحَمدُ للهِ الّذي أطعَمَني هذا وَرَزَقَنيه مِن غَيرِ حَولٍ مِنّي وَلا قُوّة )).

هەرکەسێ ئەمە بڵێ خوا لە گوناهەکانی لەوە پێشی خۆش دەبێ/ انظر صحيح الترمذي ١٥٩/٣. وصحيح سنن أبي داود ٧٦٠/٢ وهو حديث حسن.

واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم خواردنەی دامێو ڕزق و ڕۆزی دام بە بێ گۆڕان و توانای خۆم.

## داماڵین و داکەندنی پۆشاك و جل

(پـەردەی نێـوان چـاوی جنۆکـەو داوێن(عـەورەتی) ئادەمیزاد ئەوەیە کە کاتێ یەکێکیان پۆشاکی دانا بڵێ(بِسمِ الله).صحَّحَهُ الألباني(صحيح الجامع ٢٠٣/٣).

## چوونە سەر ئاو

لە پـێش چوونە ژوورەوە قاچی چـەپت پـێش بخـەو بڵـێ: (( [بِسـمِ الله] اللهُـمّ إنَـي أعـوذُ بِـكَ مِـنَ الخُبْـُثِ وَالخَبائِثَ )). أخرجه البخاري ٤٥/١ ومسلم ٢٨٣/١

واتـە: بـەناوی خـوا، خوایـە پـەنات پـێ ئـەگرم لـە شەیطانە نێرەو مێیەکان.

وه كـه هاتيتـه دەرەوه قاچـی ڕاسـت پـێش بخـەو بڵـێ: (( غُفرانَكَ )).صحّحَهُ الألباني في صحيح أبي داود برقم(٢٣).
وەپێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێت: (پـەردەی نێـوان چاوی جنۆكەو داوێنی ئادەمیزاد ئەوەیە كە كاتـێ چووە سەر ئـاو بڵـێ (بسـم الله). رواه الطبراني في الاوسط وصححه الالباني (صحيح الجامع ٢٠٣/٣)

## جل و بەرگ لەبەركردن

لە پێش دا لای ڕاست لەبەر بكە، وە بڵـێ (( ألحَمدُ للّهِ الّذي كَساني هذا وَرَزَقَنيهِ مِن غَيرِ حَولٍ مِنّي وَلا قُوّةٍ)).
(هەركەسێك ئەمە بڵـێ خوای گەورە لە تاوانەكانی پێشووی خۆش دەبێ/حديث حسن انظر(صحيح أبي داود ٧٦٠/٢) .

واتـە: ستايش بۆ ئـەو خوايـەی كـە ئـەم پۆشـاكەی پۆشـيم و پـێی بەخشـيم بـە بـێ هـيچ گـۆڕان و توانای خۆم.

## لەبەركردن و پۆشینی جل و بەرگی نویٚ

((اللهُمّ لَكَ الحَمْدُ. أنتَ كَسَوتَنيهِ. أسألُكَ مِنْ خَيرِهِ وَخَيرِ ما صُنِعَ لَهُ. وَأعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ ما صُنِعَ لَهُ )).أنظر صحيح الترمذي ١٧١/٣. وهو حديث حسن.

واتـه: خوایـه سـتایش بـۆ تۆیـه تـۆ پۆشـیمت و پۆشـتەت کـردم، داوای چـاکەی ئـەم پۆشـاکەت لیٚ ئەکەم( کە بریتی‌یە لە مانـەوە لـە ژیانـدا) وە داوای ئـەو خێـرو چـاکەیەت لیٚ دەکـەم کـە بـۆی دروسـت کراوە( کە بریتی‌یە لە لادانی بەلای ئـەو کـارەدا کـە ڕەزامەنـدی خـوای گـەورەی تیایـە)، وە پـەنات پـیٚ ئەگرم لە خراپەی‌و ئەو خراپەیەی بۆی‌ی دروست کراوە( کە بریتی‌یە لە لادانی بە لای ئەوەی بـە خـۆ بەزل زانین و فیزەوە لەبەری بکات).

## چوونە دەرەوە لەماڵ

(( بِسمِ اللهِ، تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ. لا حَوْلَ وَلا قُوةَ إلاّ باللهِ )).

(ئەگەر لە ماڵ دەرچێت و ئەمە بڵێ ئەوا پێی دەوترێت: هیدایەت درایت و کیفایەت کرایت و پارێزرایت، وە شەیطانی لێ دوور دەخرێتەوە. وە شەیطانێکی تر دەڵێ: تۆ چ دەستەڵاتێکت هەیە بەسەر کەسێك دا کە هیدایەت درابێت و کیفایەت کرابێت و پارێزرابێت/ صحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع برقم(٦٤١٩) وانظر صحيح الترمذي٣/١٥١.

واتە: بە ناوی خوا پشتم بەخوای گەورە بەست و هیچ گۆڕان و توانایەك نییە مەگەر بەخوای گەورەوە.

## گەڕانەوە بۆ ماڵ

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (( سێ کەس هەموویان مسۆگەر زامنن لە ژێر چاودێری خوای گەورەدان...)) وە لەوانە:(( رجُلٌ دَخَلَ بَيتَهُ بِسَلامٍ فَهوَ

ضامِنٌ على الله عزَّ وَجلَّ )). صحيح (صحيح سنن أبي داود ٢/٤٧٣).

واتــه: پیاوێـك بگەڕێتــەوە ماڵــەوە بـە سـڵاو کـردن زامنە لەلایەن خواوە.

وە لەفەرموودەی صەحیح دا هاتووە: (ئەگەر پیاوێك گەڕایەوە ماڵەوەو یادی خوای گەورە کرد لەکاتی چوونە ژوورەوەو نان خواردنیدا. ئـەوا شـەیطـان بەهاوەڵـەکانی دەڵێـت: لێـرە نەجێگەو نەشێومان نییە.

## لە کاتی ڕۆیشتن دا بەرەو مزگەوت

(( أللّهُمَّ اجعَلْ في قَلبي نُوراً، وَفي لِساني نوراً، وَاجعَلْ في سَمعي نُوراً. وَاجعَلْ في بَصَري نوراً. وَاجعَلْ مِنْ خَلفي نُوراً. وَمنْ أمامي نُوراً. وَاجعَلْ مِنْ فوقِي نوراً ومِنْ تَحتي نـوراً.اللهُمّ أعطِنـي نـوراً )). رواه مسـلم ٦/٥١ وابـن خزيمـة في صحيحه(٤٤٨).

واتە: خوایە نور بخەیتە دڵ و زوبان و بیستن و بینین وپاش و پێش و سەرو خوارەوەم. سا خوایە نورم پێ ببەخشی.

## چوونە ناو مزگەوت

(( اللهُمّ افتَحْ لي أبوابَ رَحمَتِكَ )).مسلم ٤٩٤/١.

**واتە: خوایە دەرگاکانی رەحمەتی خۆتم لێ بکەرەوە.**

## هاتنە دەرەوە لە مزگەوت

(( اللهُمَّ إنيّ أسألُكَ مِنْ فَضلِكَ)).مسلم٤٩٤/١

**واتە: خوایە من داوای فەزڵی خۆتت لێ دەکەم**

## پێش دەست نوێژ

**بڵێ:** (( بِسِم اللّه )).انظر ارواء الغليل ٢٢/١. وصحيح الترمذي ١٠١/١. **واتە: بە ناوی خوا.**

## نزای دوای دەست نوێژ

١- (( أشهَدُ أن لآ إلهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ له. وَأشهَدُ أنَّ محُمَّداً عَبدُهُ وَرَسولُهُ.. )). (هەرکەسێك دەست نوێژی تەواو بشۆرێ و ئەمە بڵێ هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە لەکامیانەوە ئارەزوو بکات دەچێتە ناوی/ مسلم١/٢٠٩.

واتە: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نىیە بە هەق جگە لە(الله) تاکی بێهاوبەشە. وە شایەتی دەدەم کە محمد(ﷺ)بەندەو نێردراوی خوایە.

٢- (( أللهمّ اجعَلني مِنَ التّوّابِينَ. واجعَلني مِنَ المُتَطَهِّرِينَ)). انظر صحيح الترمذي ١/١٨ وهو صحيح. صَحَّحَهُ الألباني في سنن الترمذي رقم(٤٨).

واتە: خوایە بمگێڕی لە تەوبەکارانو بمگێڕی لە خۆپاك کەرەوەکان.

٣- (( سُبحانَكَ اللهُمّ وَبِحَمْدِكَ أشهَدُ أن لا إلهَ إلاّ أنتَ أستَغْفِرُكَ وَأتوُبُ إليكَ )). (هەرکەس دەست نویژ بگریٚ و پاشان ئەمە بلّیٚ لەلاپەڕەیەکدا بۆی دەنوسریٚتەوە، پاشان مۆر دەکریٚت بە مۆریٚك ناشکیٚت تا ڕۆژی قیامەت/ وهو صحیح انظر صحیح الترغیب والترهیب(٢٢٠).

واتە: پاکیو بیٚگەردیو سوپاس بۆ تۆیە خوایە، شایەتی دەدەم کەهیچ پەرستراویٚك نییە بە هەق جگە لەتۆ، داوای لیٚخۆش بوونت لیٚدەکەمو دەگەڕیٚمەوە بۆ لات.

## وەلاّم دانەوەی بانگ بیٚژ

بانگ بیٚژ هەرچییەکی ووت تۆش دەیلّیٚیتەوە جگە لە ووتنی: (( حيَّ على الصَّلاة ــ حيَّ على الفَلاح)) کە دەبیٚ بلّیٚی:(( لا حَولَ وَلا قوةَ إلاّ باللّه )). هەر کەس ئاوا لە دلّییەوە بیلّیٚ دەچیٚتە بەهەشتەوە/ البخاری ١٥٢/١ ومسلم ٢٨٨/١.

## دوای بانگ

١- دوای وەڵام دانەوەی بانگ بێژ صلاوات بدە لەسەر پێغەمبەر (ﷺ).مسلم ١/ ٢٨٨.

٢- پاشان بڵێ «اللّهُمّ رَبَّ هذهِ الدَّعوَةِ التّامّة. وَالصّلاةِ القائِمَة.آتِ مُحَمَّداً الوَسِيلَةَ وَالفَضِيلَةَ. وَابْعَثهُ مَقاماً مَحْمُوداً الَّذي وَعَدْتَهُ». هەر کەسێك ئەم پاڕانەوەیە بڵێ کاتێ بانگ دەبیستێ بەر شەفاعەتی پێغەمبەر(ρ) دەکەوێت/ البخاري ١/١٥٢

واتە: خوایە پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوو نوێژە دامەزراوە. ببەخشە بە پێغەمبەرمان محمد(ﷺ) پلەی بەرزی (الوسیلة) (کە شوێنێکە لەبەهەشت دایە بۆ کەس نابێ جگە لەبەندەیەك لەبەندەکانی خوای گەورە، وە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئومێدم وایە کە ئەو کەسە من بم) وە (الفضیلة) کە پلەیەکی زیادەیە بەسەر دروست

کراواندا. وه بیبـه‌ره ئه‌و شوێنه سوپاس کراوه‌ی که به‌ڵێنت پێ داوه ( که پله‌ی شه‌فاعه‌تی گه‌وره‌یـه له ڕۆژی دوایی‌دا).

## سوننه‌تی ده‌ست پێکردنی نوێژ( الإستفتاح )

(( اللّهُمّ باعِدْ بَيني وَبَينَ خَطاياي كَما باعَدْتُ بَينَ المَشْرِقِ وَالـمَغْرِب. اللهُـمّ نَقِّنِـي مِـنْ خَطايـايَ كَمـا يُنَقّـى الثَّـوبُ الأبيَضُ مِنَ الـدَّنَسِ. اللهُـمّ اغسِـلْني مِنْ خَطايـايَ بِـالثَلْج وَالماءِ وَالبَرَدِ )). البخاري ١٨١/١ ومسلم ٤١٩/١.

واته: خوایه نێوان من‌و گوناهه‌کانم دوور بخه‌ره‌وه وه‌ك چـۆن رۆژهـه‌ڵات‌و رۆژئـاوات له‌یـه‌ك دوورخسـتۆته‌وه. خوایـه له‌گوناهـه‌کانم پـاکم بکـه‌ره‌وه هـه‌روه‌کو چـۆن کراسـی سـپی له‌چـڵك پـاك ده‌بێتـه‌وه. خوایـه لـه گوناهه‌کانم بمشۆره‌وه به به‌فرو باران‌و ته‌رزه.

## نزای كورنوشی قورئان خوێندن( سُجودُ التِّلاوة )

(( سَجَدَ وَجهيَ لِلّذي خَلَقَهُ. وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَولِهِ وَقُوّتهِ {فتبارَكَ اللهُ أحسنُ الخالِقينَ} )). الترمذي ٢/٤٧٤ وأحمد ٦/٣٠ والحاكم وصححه ووافقه الذهبي ١/٢٢٠والزيادة له.

واتە: ڕووم كورنوشی برد بۆ ئەوخوایەی بەدی هێناوە وبیستن و بینینی بۆ دارشتووە بە گۆڕین و توانای خۆی. پاكیو بێ كەم و كورتیو گەورەیی بۆ ئەو(الله)ی كە چاكترینی بەدی هێنەرانە.

## نزای پاش تەحییاتی كۆتایو پێش سلاودانەوە

(( اللهُمَّ إنّي أعوذ بِكَ مَنْ عَذابِ القبرِ. وَمِنْ عَذابِ جَهَنَّم،وَمِنْ فِتنَةِ المَحْيا وَالمَماتِ. وَمِنْ شَرِّ فِتنةِ المَسيحِ الدَّجّالِ )). البخاري ٢/١٠٢ ومسلم ١/٤١٢ واللفظ لمسلم.

واتە: خوایە پەنات پێئەگرم لە سزای گۆڕو سزای دۆزەخ و ئاشوبەی ژیان و مردن و خراپەی

ئاشـووبەی چـاو سـڕاوەی هـەق داپۆشـەر(المَســيح الدَّجال).

## ویردی دوای سلاودانەوەی نوێژ

(( سُـبحانَ اللّه )) ٣٣جـار (( الحَمْـدُ للّهِ )) ٣٣جـار(( اللّهُ أكبَـر)) ٣٣جـار ئینجـا بڵـێ: (( لا إلـهَ إلاّ اللّه وَحـدَهُ لا شـريَكَ لَـهُ. لَـهُ المُلْـكُ لَـهُ الحَمْـدُ وَهـوَ علـى كُـلِّ شـيءٍ قَديرٍ)).(هەرکەسێك ئەمە بڵێت لەدوای هەموو نوێـژێکی فەرز ئەوا خوای گەورە لەگوناهەکانی خۆش دەبێ ئەگەر چی بەوێنەی کەفی دەریا بێت) مسلم ٤١٨/١.

## نزاو پاڕانەوەی دڵتەنگیو خەفەت

(( اللهُـمّ إنّي عَبْدُكَ ابنُ عَبْدِكَ ابنُ أمَتِكَ. ناصيَتي بِيَدِكَ. ماضٍ فيّ حُكْمُكَ. عَدلٌ فيّ قَضَـاؤُكَ. أسأَلُكَ بِكُلِّ اسمٍ هُوَ لَكَ سَمَّيْتَ بهِ نَفْسَكَ. أو أنْزَلْتَهُ في كِتابِكَ. أو عَلَمْتَهُ أحداً مِنْ خَلْقِكَ. أو استأثَرْتَ بهِ في عِلْمِ الغَيْبِ عِنْدَكَ.

أنْ تَجْعَلَ القُرآنَ رَبيعَ قَلْبِي. وَنُورَ صَدْري. وَجَلاءَ حُزني. وذَهابَ هَمّي )).هەرگیز هیچ کەسێك نىیە کە تووشى ناخۆشى و خەفەتێك دەبێت و بڵێت...فەرموودەکە .... ئیلا خوای گەورە غەم و خەفەتەکەی لادەبات و شوێنەکەی پڕدەکاتەوە بە دەرو لێکردنەوە و دڵخۆشیو کامەرانی. ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەبەری نەکەین؟ فەرمووی: بەڵێ پێویستە هەرکەسێك دەیبیستێت لەبەری بکات/أحمد ٣٩١/١ وصححه الألباني. انظر سلسلة الأحاديث الصحيحة(٣٣٦/١) رقم(١٩٩).

واتە: خوایە من بەندەتم کوڕی بەندەتم کوڕی کەنیزەكو کۆیلەکەتم. نسیب و ناوچەوان و چارەنوسم بەدەست تۆیەو حوکمو بڕیارت بەسەرمدا رابووردووە. بڕیاردانت بەسەرم دا دادپەروەرانەیە. داوات لێ دەکەم بەهەموو ناوێك کە هەتەو خۆتت پێ ناوناوە.یان لەکتێبەکەت دا

ناردووتەتە خوارەوە.یان فێری یەکێك لە دروست کراوەکانت کردووە. یان لە عیلمی غەیبدا

## نزاو پاڕانەوەی قەرزاری

(( اللهُـمَّ أكفِنـي بِحَلالِـكَ عَـن حَرامِـكَ. وأغْنِنــي بِفَضـلِكَ عَمَّـنْ سِـواكَ )).هەرکـەس ئەمـە بڵـێ و بـە ئەنـدازەی شـاخی (صبیر) قەرزار بێت، خوای گەورە دانەوەی بۆ ئاسان دەکات/ حَسَّـنَهُ الألْبـانِي فِي صَحِيحِ الجـامع(٢٦٢٥) وانظـر صـحيح الترمـذي ٣/١٨٠ .

واتە: خوایە بە حەڵاڵی خۆت تێرم بکەو بێنیازم بکە لەحەرامت تا مەجبوری نەبم و بە فەزڵی خۆت دەوڵەمەندو بێنیازم بکە لە غەیری خۆت.

## ئەگەر کارێکت لەسەر گران بوو

(( اللهُمّ لاسَهْلَ إلاّ ماجَعَلتَهُ سَهلاً. وأنتَ تَجعَلُ الحَزْنَ إذا شِئتَ سَهلاً )) رواه ابن حبان في صحيحه برقم (٢٤٢٧) (موارد) وابن السني برقم (٣٥١) وقال الحافظ: هذا حديث صحيح. وصحّحه عبدالقادر الارناؤوط في تخريج الاذكار للنووي ص (١٠٦).

واتە: خوایە هیچ کارێکی ئاسان نییە مەگەر ئەوەی تۆ ئاسانت کردووە. وە تۆ ئەگەر ویستت لێ بێ زبریو ڕەقیو گرانی زەوی ئاسان دەکەیت.

## لە کاتی پژمین( العَطَس )دا

ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی با بڵێ: (( ألحَمْدُ للهِ ))

واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە لەسەر هەموو حاڵێك. وە با براکەی یان هاوەڵەکەی پێی بڵێ: (( يَرْحَمُكَ الله )).واتە:خوا ڕەحمت پێبکات،

وە ئەگـەر وتـی: (( يَرحَمُكَ اللّٰه )) ئـەم پـێی بڵـێ: ((يَهديكُمُ اللّٰه وَيُصلِحُ بالَكم )). (٢٧٩) البخاري ١٢٥/٧.
واتـە: خـوا ڕێنمایتـان بکـات و حاڵتـان بـۆ چـاك بکات.

## لە کاتی باوێشك دان( التّثاؤب )دا

١– (( باوێشك لـە شـەیطانەوەیە.ئەگـەر باوێشـكت هـات تـا دەتـوانی بیگێـڕەوە چـونكە شـەیطان لەوکاتەدا پێت پێ دەکەنێت )). البخاري ٥٠١/١٠
٢– (( ئەگەر باوێشکت دا دەست بخەرە سەردەمت چونکە شەیطان دەچێتە ناوی )). رواه مسلم (٢٩٩٥)

## نزاو پاڕانەوە بۆ موسڵمانێك ئەگەر هاوسەری هێنا( دوای مارە بڕین )

پێی بڵێ: (( بارَكَ اللهُ لَكَ. وَبارَكَ عَلَيكَ. وَجَمَعَ بَينَكُما في خَيرٍ )).انظر صحيح الترمذي ٣١٦/١.

واتە: خوا لێت پیرۆز بکات و بەرەکەت بڕژێ بە سەرت داو لەسەر خێر کۆتان بکاتەوە.

## نزای پێش چوونە لای خێزان و ( جیماع کردن )

(( بِسْـمِ اللهِ. اللهُـمّ جَنِّبْنـا الشَّـيطانَ. وَجَنِّـبِ الشَّـيطانَ مارَزَقْتَنـا)). ئەگەر ئەمە بڵێ‌و منداڵیان بوو ئەوا شەیطان هەرگیز ناتوانێ زیانی پێبگەیەنێ/ البخاري ١٤١/٦ ومسلم ١٠٢٨/٢.

واتە: بە ناوی خوا. خوایە شەیطانمان لێ دوور بخەرەوەو شەیطان لەو منداڵەش دوور بخەرەوە کە پێمان دەبەخشی.

## نزا بۆ نەخۆش لە کاتی سەردانی کردنیدا

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر بچوایە بۆ سەردانی نەخۆشێك پێی دەفەرموو: (( **لا بَأسَ طَهورٌ إن شآءَاللهُ** )). البخاري مع الفتح ١١٨/١٠.

واتە هیچ نیە پاك دەبێتەوە لە گوناه بە ویستی خوای گەورە.

## نزاو پاڕانەوەی نەخۆش بۆ خۆی

(دەستت بخەرە سەر ئەو شوێنەی ئازاری هەیە لە لەشت داو سێ جار بڵێ: (( **بِسمِ اللهِ** )) وە حەوت جار بڵێ: (( أعوذُ بِاللهِ وَقُدرَتِهِ مِنْ شَرِّ ما أجِدُ وأُحاذِرُ)). مسلم ١٧٢٨/٤.

واتە: پەنا ئەگرم بە خوای گەورەو قودرەت و توانای لە خراپەی ئەو ئازارەی هەستی پێئەکەم و سڵی لێ دەکەمەوە.

## ئەگەر تووشی موسیبەتێك بوو( کەسێکی مرد )

(( ﴿ إِنّا للهِ وَإِنّا إِليهِ راجعونَ﴾ اللهُمّ اجْرْني في مُصيبَتي وَأخلِفْ لي خَيراً مِنها )). هیچ موسڵمانێك نىیە كه موسیبەتێکی ئاوای تووش ببێ و وەك ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێکردووە بڵێ (إنّا لله ......) (فەرموودەکە...) ئیلا خوای گەورە کەسێکی چاکتری لە پاش ئەو بۆ دەخاتە شوێنی/ مسلم ٦٣٢/٢

واتە: ئێمە موڵکی خواین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە. خوایە پاداشتم بدەیتەوە لەم موسیبەتەمداو کەسێکی باشترم بۆ بخەرەوە جێگەی.

## لەکاتی سەردانی گۆڕستان دا

(( السّلامُ عَلَيكُمْ أهلَ الدّيار. مِنَ المُؤمِنينَ وَالمُسلِمِينَ. وإنّا إنْ شآءَ اللّهُ بِكُم لاحِقونَ [وَيَرحَمُ اللّهُ المُستقدِمينَ مِنّا وَالمُستَأْخِرينَ ] أسألُ اللّهَ لَنا وَلَكُمُ العافِيةِ)).مسلم ٦٧١/٢.

وابن ماجه واللفظ لە ٤٩٤/١ عن بريدة (رضي الله عنها). وە نێوان دوو کەوانەکە لەو فەرموودەیە کە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیگێڕێتەوە.

واتــه: ســلاوتان لێ بێــت خــاوەنی خانــەکان لــە ئیمانداران و موسلمانان ئێمەش بە ویستی خوای گــەورە دەگــەین پێتــان. خــوا بــەزەیی بــە پێشکەوتوەکانمان و دواکەوتەکانماندا بێتەوە. لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە ئێمەو ئێوەش بپارێزێ.

## لە کاتی هەڵکردنی( بــا )دا

(( اللهُمّ إنّي أسأَلُكَ خَيرَها. وَخَيرَ مافِيها. وَخَيْرَ ما أُرسِلَتْ بهِ، وَأعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّها. وَشَرِّ ما فِيها. وَشَرِّ ما أُرسِلَتْ بِهِ)).مسلم ٦١٦/٢ والبخاري ٧٦/٤.

واتــه: خوایــه مــن داوای خێــرو چــاکەکەیت لــێدەکەمو ئەوچــاکەیەی کــە تیایــەتیو ئــەو چاکەیەی بۆی نێردراوە. وە پەنات پێئەگرم لە خراپەکەیو لەو خراپەیەی کە تیایەتیو ئەو خراپەیەی بۆی نێردراوە.

## له کاتی باران باریندا

(( اللهُـمّ صَـيّباً نافِعاً )). البخـاري مع الفتح ٥١٨/٢. وه بـه (اللـهم صيبا هنيئا) هاتووه. أخرجه أبو داود (٥٠٩٩) وصححه الآلباني في صحيح سنن أبي داود

**واته: خوايه بارانێكی به لێزمه‌ی به سوود بێت.**

## له كاتی به‌ربانگ كردنه‌وه‌دا

(( ذَهَـبَ الظّمَـأُ وَابتَلّـتِ العـرُوقُ. وَثَبَـتَ الأَجْـرُ إن شـاءَ الله)).أخرجه أبوداود ٣٠٦/٢ وغيره. وانظر صحيح الجامع ٢٠٩/٤.

**واته: تینوویه‌تی ڕۆیشت وده‌ماره‌كان ڕه‌وینه‌وه‌و پاداشته‌كه‌شمان چه‌سپاوه‌و مسۆگه‌ره به ویستی خوای گه‌وره.**

## نزاو پاڕانەوەی شەوی قەدر( لَيلَةُ القَدر )

(( اللهُمّ إنّكَ عَفُوٌّ[كَريمٌ] تُحِبُّ العَفوَ فاعفُ عَنّي)). صحيح (صحيح ابن ماجه ٢/ ٣٢٨) بدون لفظ:(( كريم )). والترمذي (صحيح الترمذي)(٢٧٨٩) بهذا اللفظ وصحّحَهُ الألباني.

**واتە: خوایە تۆ لێبووردەو بەخشندەیت و لێبووردنت پێخۆشە. ساخوایە لێم خۆش بەو لێم ببورە.**

## لەکاتی سەربڕین و قوربانیدا

(( بِسمِ اللهِ وَاللهُ أكبَرُ،[ أللهُمّ مِنكَ وَلَكَ]. أللهُمّ تَقَبَّلْ مِنّي)).مسلم ٣/ ١٥٥٧ والبيهقي ٩/ ٢٨٧ ومابين المعكوفين للبيهقي ٩/ ٢٨٧ وغيره والجملة الأخيرة سقتها بالمعنى من رواية مسلم.

**واتە: بە ناوی خواو خوا گەورەیە. خوایە لە تۆوەیەو بۆ تۆیە. خوایە لێم وەرگرەو لێم قبوڵ بکە.**

## له كاتی تووڕەبووندا

١- بڵـێ: (( أعـوذُ بـاللهِ مِـنَ الشَّـيطانِ الـرّجيم )). البخـاري ٩٩/٧ ومسلم ٢٠١٥/٤.

واتـه: پـەنا دەگـرم بـه خـوای گـەوره لـه شـەيطـانـی نەفرەت لیٚكراوو دوورخراوه له ڕەحمەتی خوا.

٢- وه سوننەته ئەگەر به پێوەی دابنیشیو ئەگـەر دانیشووی ڕابكشێیت/أبو داود(٤٧٨٢) وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود.

## ئەگەر كەسێكی تووش بوو به بەلاٌیەكت بینی

بلٌـێ: (( ألحَمدُ لله الَّذي عافاني مِمّا ابتَلاكَ بهِ. وَفَضَّلَني عَلى كَثيرٍ مِمَّن خلَقَ تَفضيلاً )).هەركەسێ ئەمه بلٌێ لەو بەلاٌیەی تووش نابێ/ انظر صحيح الترمذي ١٥٣/٣.

واته: ستایش بۆ ئەو خوایەی منی پاراست لەوەی تووشــی تـۆی كـردوەو فـەزڵی منــی داوه بەســەر زۆرێك له دروست كراوەكانیدا.

## کەفارەتی دانیشتگا( مەجلیس )

(( سُبحانَكَ اللهُمّ وَبِحَمـدِكَ. أشـهَدُ أنْ لا إلـه إلاّ أنـت. أستغفِرُكَ وَأتوبُ إلَيكَ )).هەرکەسێك لە مەجلیسێکدا دابنیشێ و زۆر هەڵەو قسەی بێبایەخی تێدا بکات و پێش ئەوەی لەو مەجلیسە هەستێ بڵێ...(فەرموودەکە).. ئیلا خوا لە تاوانی ئەو مەجلیسەی خۆش دەبێ/ أخرجه أصحاب السنن وهو صحيح، وانظر صحيح الترمذي ٣/١٥٣.

واتە: خوایە پاك و بێگەردیو ستایش بۆ تۆیە. شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە تۆ، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات.

## کەفارەتی سوێند خواردن بە غەیری خوا

(هەرکەسێ سوێندی خواردو وتی بە لات و عوزا با بڵێ: (( لا إلَهَ إلاّ الله )). وە هەر کەسێك بە

هاوڕێکەی ووت: وەرە با قومارت لەگەڵ بکەم با خێرێك بکات). البخاري ٦٧/١١٤ ومسلم (١٦٤٧).

## پاڕانەوەی سوار بوونی وولاغ یان ئامێری گواستنەوە

(( بِسمِ اللهِ. الحَمدُ للهِ. ﴿ سُبحانَ الّذي سَخّرَ لنا هذا وَما كُنّا لَهُ مُقرِنينَ*وإنّا إلى ربِّنا لَمَنْقَلبونَ ﴾ الحَمدُ للهِ. الحَمدُ للهِ. الحَمدُ للهِ. اللهُ أكبر. أللهُ أكبر أللهُ أكبرُ. سُبحانَكَ اللهُمَ إنّي ظَلَمْتُ نَفسي فاغفِرْ لي فإنّهُ لا يَغفِرُ الذُّنوبَ إلاّ أنتَ)). أبوداود ٣٤/٣ والترمذي ٥٠١/٥ وانظر صحيح الترمذي ١٥٦/٣.

واتە: بە ناوی خوا. ستایش بۆ خوا. پاکیو بێ کەم و کورتیو گەورەیی بۆ ئەو خوایەی ئەمەی بۆ ژێربار خستوین و ئێمە دەستەلاتمان نەبوو بە سەریدا، وە ئێمە(لە ڕۆژی دوایی‌دا) بۆلای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. سوپاس و ستایش

بـۆ خـوا... خـوا گەورەیـە... پـاکیو بـێ کـەم و کورتیـو گـەورەیی بـۆ تۆیـە خوایـە مـن سـتەمم لـە نەفسـی خـۆم کـردووەو لـێم خـۆش بـە. بەڕاسـتی کەس لە گوناھ خۆش نابێ جگە لە تۆ.

## نزاو پاڕانەوەی چوون بۆ گەشت (سەفەر)

(( اللهُ أكبَرُ. اللهُ أكبَرُ. اللهُ أكبَرُ. ﴿ سُبحانَ الَّذي سَـخَّرَ لَنا هذا وَما كُنّا لَهُ مُقرنينَ * وَإنّا إلى رَبِّنـا لَمُنقَلِبـونَ ﴾ اللهُمّ إنّا نَسألُكَ في سَفَرِنا هذا البِرَّ وَالتّقوَى. وَمِنَ العَمَلِ ما تَرضَى. اللهُـمّ هَوِّنْ عَلَينا سَفَرَنا هذا وأطْوِ عَنّا بُعْدَهُ. اللهُـمّ أنـتَ الصّـاحِبُ فـي السَّـفَرِ. وَالخَليفَـةُ فـي الأهـلِ. اللهُمّ إنّي أعوذُ بِكَ مِنْ وَعثآءِ السّفرِ. وَكآبةِ المَنْظَرِ. وَسُوءِ المُنقَلَـبِ فـي المـالِ والأهـلِ )).وە ئەگـەر گەڕایـەوە لەسـەفەر دەیڵێتـەوەو ئەمـەی بـۆ زیـاد دەکـات: ((آيبونَ. تائِبونَ. عابِدونَ. لِرَبِّنا حامِدونَ )). مسلم ٢/٩٩٨.

واتـه: خـوا گەورەیـە ... پـاكی و بێگـەردی بـۆ ئـەو خوایــەی ئەمــەی بــۆ ژێــر بــار خســتووین و ئێمــە دەســتەڵاتمان نـەبوو بەسـەری‌دا، وە ئێمە(لـە ڕۆژی دوایی‌ــدا)بۆ لای پــەروەردگارمان دەگەڕێینــەوە. خوایــە لــەم گەشــتەماندا داوای كــردەوەی چــاك و ڕەفتــاری جــوان و تــەقوات لــێ‌دەكەین و داوای كارێكـت لـێ دەكـەین كـە پـێی ڕازی بیـت. خوایـە ئەم گەشتەمان بۆ ئاسان بكەو دووری‌یەكەیمان بۆ نزیــك بخــەرەوە. خوایــە تــۆ ئاگــات لێمانــە لــە گەشـتەكەمانداو تـۆ پـارێزەری كەس‌وكارمانی(كـە جێمـان هێشـتون). خوایـە پـەنات پـێ ئـەگرم لـە نارەحەتی و ناسۆری گەشت و غەمباری رواڵـەت و شـتێك كـە غـەمبارم بكـات و خـراپ گەڕانـەوە بـۆ مـاڵ و خێـزان (بـەوەی كـە شـتێكیان لـێ‌ببینم دڵ تــەنگم بكــات)... گەڕاینــەوە لــە بێ‌ئاگــایی

(بە ویستی خوا). بەتەوبەکردن و پەرستشەوە، ستایشی پەروەردگارمان دەکەین.

## نزای چوونە بازاڕ

(( لآ إلهَ إلاّ الله وَحدَهُ لا شريكَ لَهُ. لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ. يُحيي وَيُميتُ. وَهوَ حيٌّ لا يموتُ. بِيَدِهِ الخَيرُ وَهوَ عَلَى كُلّ شيءٍ قَدير )). هەرکەسێ ئەمە بڵێ هەزار هەزار(ملیونێك) چاکەی بۆ دەنوسرێ و هەزار هەزار گوناهی لێ هەڵدەوەرێ و هەزار هەزار پلە بەرزدەبێتەوە لای خوای گەورە(وەماڵێکی لە بەهەشت دا بۆ دروست دەکرێت) / حسنه الالباني في صحيح ابن ماجه ٢/٢١ وفي صحيح الترمذي ٣/١٥٢. وانظر ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير ٢/٤١٣

واتە: هیچ پەرستراوێك نىيە بە هەق جگە لە (الله) تاکی بێهاوەڵەو موڵك و ستایش بۆ ئەوەو ئەژیەنێو ئەمرێنێو خۆی زیندووەو هەرگیز

نامرێ. خێرو چاكە بەدەست ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بە تواناو دەستەلاتدارە.

## نزاو پاڕانەوەی گەشتیار ئەگەر دابەزییە جێگایەكلە گەشتەكەیدا یان لە غەیری گەشت دا

بڵـێ: (( أعوذُ بِكَلِماتِ اللهِ التّامّاتِ مِن شَرِّ ما خَلَقَ )).

ئەگەر ئەمە بڵێ هیچ شتێك زیانی پێناگەیەنێ تا لەو شوێنەی بار دەكات/مسلم ٤/ ٢٠٨٠.

واتـە: پـەنا ئـەگرم بـە ووشـە تـەواوەكانی خـوای گەورە لە خراپەی دروست كراوەكانی.

## لە كاتی هاتنی شتێكی خۆش یان ناخۆشیدا

پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئەگــەر شـتێكی خۆشــی بەسەردا بهاتایە دەیفەرموو: (( ألحَمْدُ للهِ الّذي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصّالِحات )).واتـە: سوپاس و ستایش بۆ ئـەو

خوایەی کە بە نیعمەتی ئەوەوە هەموو چاکەکان تەواو دەبێ.
وە ئەگەر شتێکی ناخۆشی بەسەردا بهاتایەوە دەیفەرموو:(( ألحَمْدُ للهِ على كُلِّ حالٍ )). واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوایە لەسەر هەموو بارێك.
صحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع ٤/٢٠١.

## لە کاتی خوێندنی کەڵەشێرو زەڕەی گوێدرێژدا

(( ئەگەر گوێتان لە دەنگی کەڵەشێر بوو داوای فەزڵی خوای گەورە بکەن (( اللهُمّ إنّي أسألُكَ مِن فَضلِكَ )) چونکە مەلائیکەتی بینیوە. وە ئەگەر گوێتان لە دەنگی زەڕینی گوێ درێژ بوو پەنا بگرن بەخوای گەورە لە شەیطان (( أعوذُ باللّهِ مِنَ الشيطانِ الرّجيمِ )) چونکە شەیطانی بینیوە )) البخاري مع الفتح ٦/٣٥٠ ومسلم ٤/٢٠٩٢.

## ئەگەر گوێت لە دەنگی سەگ بوو بە شەو

(( إذا سَمِعْتُم نُباحَ الكِلابِ وَنَهيقَ الحَميرِ باللّيلِ فتَعَوَّذوا بِاللهِ مِنهُنَّ فإنّهُنَّ يَرَينَ ما لا تَرونَ )).صَحَّحَهُ الألباني في صحيح أبي داود ٩٦١/٣.

واتە: ئەگەر گوێتان لە دەنگی وەڕینی سەگ و زەڕەی گوێ درێژ بوو بە شەو ئەوا پەنا بگرن بەخوای گەورە لێیان چونکە ئەوان شتێك دەبینن لەو کاتەدا کە ئێوە نایبینن.

## لە کاتی سەرسووڕمان و بینینی شتی سەیردا

١- (( سُبحانَ اللهِ )). البخاري مع الفتح ٢١٠/١ومسلم ١٨٥٧/٤.

واتە: پاك و بێگەردی بۆخوایە.

٢- (( اللهُ أكبر )).البخاري مع الفتح ٤٤١/٨

واتە: خوا گەورەیە.

## چی دەڵێت ئەگەر لە چاوی خۆی ئەترسا بدا لە شتێك و ببێتە هۆی زیان پێگەیاندنی

((﴿ ماشآءَ اللهُ لا قُوّةَ إلاّ باللهِ ﴾ اللهُمّ بارِك عَلَيهِ)).

بۆ بەشی یەکەمی بڕوانە سورەتی (الكهف) ئایەتی ( ٣٩) . وە بۆ بەشی دووەمیش پێغەمبەری خوا(ρ) دەفەرموێت: ((ئەگەر یەکێك لە ئێوە شتێکی لەبراکەی یان لە خۆی یان لە ماڵو سامانیدا بینی کە سەرسامی‌کردبوو وە بەلایەوە سەیربوو (با بپاڕێتەوە بۆی بە بەرەکەت). چونکە چاو ڕاستو ڕەوایە)) صَحّحَهُ الألباني في صحيح الجامع ٢١٢/١.

**واتە: ئەوەی خوای گەورە ویستی ببێت دەبێو هێزو توانایەك نییە مەگەر بەخواوە. خوایە فەڕو بەرەکەتی تێبخە.**

## ئەگەر لە چاوی یەکێك ترسایت

(( سـورەتـی ﴿ الفَلَـق ﴾ و ﴿ النّـاس ﴾ بخوێنـە)). رواه الترمذي والنسائي وابن ماجه عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه). حديث حسن/انظر الاذكار للنووي ص ٢٨٣.

## ئەگەر کەسێك چاو لێی دا

( بـا چـاو پیسـەکە دەسـت نوێـژ بگرێـت و پـاشـان ئاوی دەست نوێژەکە بکەن بەسەر ئەو کەسەدا کـە چـاو لێـی داوەو خـۆی پـێ بشـوات ).أبـي داود ٩/٤ بإسنادٍ صحيح على شرط البخاري ومسلم عن عائشة( رضى الله عنهـا) وزاد المعاد ١٦٣/٤. انظر الاذكار للنووي ص ٢٨٣.